# كليلى

# تاوانه كان

وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ

البقرة /١٥٩

د/عبدالنور محمد

زۆرن ئەوانەی درۆ بۆتە پیشەی رۆژانەیان، تاکو درۆیێك هەبێ وشەیێکی ڕاست لەدەمیان نایەتە دەرەوە، بەتایبەتی لەمانگی نیسان. دواتریش بەشانازییەوە بۆ خەڵك باسی دەکەن و دیگێڕنەوە، بێ ئاگان لەوەی بەر نەفرەت و تووڕەیی خودا کەوتوون هەروەك دەفەرموێ ﴿لَّعْنَتَ اللَّهِ عَلَى الْكَاذِبِينَ﴾ آل عمران/٦١
واتە : ( نەفرەتی خوا لەدرۆزنان ) هەروەها کەسێك زێدە ڕەوی لەدرۆ بکات خودا هیدایەتی نادا هەروەك دەفەرمووێ : ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ كَذَّابٌ﴾ غافر/٢٨ واتە : ( بێ گومان ڕێنموویی کەسێ ناکات زیادە ڕەو درۆزن بێ .. )

- لەبەرامبەر ڕاستگۆیانیش خودا دەفەرموێ ﴿قَالَ اللَّهُ هَٰذَا يَوْمُ يَنفَعُ الصَّادِقِينَ صِدْقُهُمْ ۚ لَهُمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ۚ رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ ۚ ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ المائدة/١١٩ واتە : ( خوای گەورە فەرمووی ئەمە رۆژێکە ڕاستبێژان ڕاستییەکەیان سوودیان پێ دەگەیێنێ، بەهەشتانێکیان بۆ هەیە ( رووبارەکان بەژێریان دادەڕۆن و لەمێننەوە تیایدا بەهەمیشەیی خوا ڕازی بوە لێیان، ئەوانیش لەخوا ڕازی بوون؟! ئەوەیە گەورەترین سەرکەوتن .

- لەئایەتێکی تر، خودا ناوی ڕاستگۆیان لەدوای ناوی پێغەمبەران دەهێنێ و لەبارەیانەوە دەفەرموێ : ﴿وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَٰئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُولَٰئِكَ رَفِيقًا﴾ النساء/٦٩ واتە : ( هەرکەسێك گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر بکات، ئەوانە لەگەڵ کەسانێکن کە خوا بەهرەی ڕشتووە بەسەریاندا لەپێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان، ئەوانە چ هاوڕێ هاوەڵێکی چاکن. )

- لەگەڵ ئەوەی خودای گەورە زمانی لەنێوان دوو دیواری پتەودا پاراستووە، یەکێکیان دیواری ددانەکان و ئەوی تریش دیواری لێوەکان، بەڵام خودی کەسەکە زمانەکەی بەشێوازێکی نادروست دەجوڵێنێ و سەرەنجام دەکەوێتە بەرتوڕەیی و خەشمی خودا هەروەك پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی (( ثلاثة لايكلمهم الله يوم القيامة ولايزكيهم ولا ينظر اليهم : شيخ زان وملك كذاب وعائل مستكبر )) واتە : سێ کەس هەن لەرۆژی دوایی دا، خودا ئەقسەیان لەگەڵ دەکات، نە پاکیان دەکاتەوە، نەتاماشایان دەکات!! پیاوێکی پیر زینا بکات، دەسەڵاتدارێکی درۆزن، هەژارێکی خۆبەزل زان.

- ئەگەر دەتەوێ خۆت لە گرۆهو تاخمی موناڤیقان ( دوو ڕووان ) جیابکەیتەوە، هیچ کاتێك پەنا مەبە بەر درۆ، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (( اية المنافق ثلاث، اذا حدث كذب واذا وعد اخلف واذا اوتمن خان )) .

واتە : ( نیشانەی دوو رووان سێیە!! ئەگەر قسەی کرد، درۆ دەکا، ئەگەر پەیمان و بەڵێنی دا، نایەنگەیێنێتەرسەر، ئەگەر ئەمانەتێکی پێ سپێرا، خیانەتی لێ دەکات پەنا بەخوا لەو جۆرە کەسانە چونکە خودا هەڕەشەیان لێ دەکات و لەبەرەیانەوە دەفەرموێ : إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ النساء/١٤٥
واتە : ( بەڕاستی دوو ڕووەکان لەخانەو چینی هەرە ژێرەوەی ئاگردان )
- تەنها مرۆڤەکان توشی ئەزیەت نابن، کاتێک کەسێک درۆ دەکات، بەڵکو فریشتەکانیش لەدەست ئینسانی درۆزن تووشی ئازار دەبن هەروەک پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (( اذا كذب العبد تباعد عنه الملك الموكل به ميلا من نتن ماجاء به )) واتە : کاتێک بەندەیێک درۆ دەکات بۆنی دەمی هێندە ناخۆش و بۆگەنە فریشتەکانی سەرشانی بەقەد مەسافەی یەك میل لێی دوردەکەونەوە بەسەبەب ئەو درۆیەی کردوویەتی.
- خوای گەورە بانگەواز دەکات بۆ هەر کەسێ خۆی بەبڕوادار دەزانێ و دەفەرمووێ : يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ التوبة/١١٩ واتــە : ( ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە خۆتان بپارێزن لە تۆلەی خواو لەگەڵ ڕاستگۆیاندابن و لەریزی ئەواندابن ) ئەگەر پێغەمبەر ﷺ بیزانیبا کەسێک درۆ دەکات.. رووی لێ وەردەگێڕاو هاتوچۆی نەدەکرد، هەتا ئەو کاتەی هەواڵی تۆ دەهات، ئەو کەسە تۆبەی کردووە، ئینجا رووی دەدایێ و گفت و گۆی لەگەڵ دەکرد.
- لەبەرامبەر ڕاستگۆیانیش دا پێغەمبەری خۆشەویستمان محمد (المصطفى) بەهەشت بۆ کەسانێك مسۆگەر دەکات پارێزگاری لەچەند شتێك بکات هەروەك فەرموویەتی : (( اضمنوا لي ستا من انفسكم اضمن لكم الجنة : اصدقوا اذا حدثتم، واوفوا اذا عاهدتم، وادوا اذا أؤتمنتم، واحفظوا فروجكم، وغضوا ابصاركم وكفوا ايديكم )) واتە : پارێزگاری لەشەش شت بکەن لەنەفسی خۆتان منیش بەهەشتتان بۆ مسۆگەردەکەم؟! ڕاستگۆبن کاتێك قسەتان کرد، وەفاتان هەبێ لەبەرامبەر پەیمانەکانتان.. کاتێك ئەمانەتێکتان پێ سپێردرا بیپارێزن و بیدەنەوە دەست خاوەنەکەی. داوێنی خۆتان بپارێزن لەزیناو حەرام.. چاوەکانتان لەئەزەری حەرام بپارێزن.. دەستەکانیشتان لەکردەوەی خراپە بپارێزن )
- باجیاوازیێك لەنێوان کەسێکی ڕستگۆ و کەسێکی درۆزندا بکەین.. بزانین ئایا ئێمە لەکامەیانین؟ تاکو تووشی ئەفرەتی خودا نەبین :

| ڕاستگۆ لەدنیادا | درۆزن لەدنیادا |
| --- | --- |
| ١- خەڵک ڕێزی دەگرن و خۆشیان دەوێت.. | ١- خەڵک بەچاوی سووک سەیری دەکەن و ڕقیان لێ یەتی. |
| ٢- هەرچی بڵێ باوەڕی پێدەکەن و جێگای متمانەیە.. | ٢- ئەگەر ڕاستیش بڵێ کەس باوەڕی پێ ناکا، جێگای متمانە نیە. |
| ٣- دۆست و خۆشەویستی خوداو فریشتەکانە، دوژمنی شەیتانە. | ٣- دۆست و خۆشەویستی شەیتانە، دوژمنی خوداو فریشتەکانە. |

| ڕاستگۆ لەقیامەتدا | درۆزن لەقیامەتدا |
| --- | --- |
| ١- لەگەڵ پێغەمبەران و شەهیدان و پیاوچاکانە. | ١- لەگەڵ ئەبو جەهل و فیرعەون و هامان و قارونە. |
| ٢- پاداشتی ڕاستگۆییەکەی وەردەگری بەبەهەشت و خۆشییەکانی. | ٢- سزای درۆکردنەکە وەردەگری بەدۆزەخ و ناخۆشییەکانی. |
| ٣- دڵ خۆش و ڕوو گەشە. | ٣- دڵ تەنگ و ڕوو ڕەشە. |

**- لە پێغەمبەریان پرسی ﷺ ئەوکەسانەی دەچنە دۆزەخ.. چ کردەوەیەکیان کردووە؟ تاکو ئێمە خۆمانی لێ بپارێزین.. ئەویش فەرمووی (درۆ) هەر کەسێک درۆبکات تووشی تاوان و خراپەکاری دەبێ، هەرکەسێکیش تووشی تاوان و خراپەکاری بێ سەرەنجامی چوونە دۆزەخە.**

**- هاوەڵێک لە پێغەمبەری پرسی ﷺ ئایا دەکرێ مرۆڤی بڕوادار ترسنۆک بێ؟ فەرمووی بەڵێ، ووتی ئایا دەکرێ مرۆڤی بڕوادار ڕەزیل بێ؟ فەرمووی بەڵێ. وتی ئایا دەکرێ مرۆڤی بڕوادار درۆزن بێ؟ فەرمووی نەخێر..**

- ئایا دەزانی درۆ سەبەبێکە بۆ چوونە ناو دۆزەخ؟
ئایا دەزانی درۆ کەسایەتیت لەدەست ئەدا؟
- ئایا دەزانی درۆ بەرەکەتی ڕزق ئەبەنێ؟
ئایا دەزانی درۆ بەکێکە لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی؟
- ئایا دەزانی درۆ خراپترین خیانەتە؟
ئایا دەزانی درۆ دڵ ڕەش دەکا؟
- ئایا دەزانی هەموو خراپەو شەڕەکان لەدرۆ وە سەرچاوە دەگرن؟
ئایا دەزانی ئەو زمانەی تۆ درۆی پێ دەکەی، لەرۆژی دوایی دا شایەدیت لەسەر ئەدا؟
- ئایا دەزانی ئەو کەسەی درۆ دەکا.. لەرۆژی دوایی دا، دەم و لێوەکانی بەمەقەسی ئاگرین پارچە پارچە دەکرێ؟

**- لەکۆتایی کورتە نامەکەم دا دەڵێم.. برای بەڕێز، خوشکی ئازیزم تۆ سەربەستی چۆن زمانت دەجوڵێنی، بەڵام دەبێ بزانی بەهەشتێکی پڕ لەئازو نیعمەت و نەبڕاوە ئامادەیە بۆ ڕاستگۆیان و چاکە کاران، دۆزەخێکی سوتێنەرو پڕ لەئەشکەنجەو ئازاریش لەگڕدایە بۆ درۆزنان و تاوانباران..**

بڵاوکراوەی کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی - هەولێر / 0662233868